

# ژن لە جیهانی ئەدەبی
# شێرزاد حەسەندا

هاوژین حەمە ڕەشید

لێکۆڵینەوی ئەدەبی

# ژن لە جیهانی ئەدەبی
# " شێرزاد حەسەن"دا

هاوژین حەمەڕەشید

کوردستان/ هەولێر
٢٠١٠

لەبلاوکراوەکانی سەنتەری لێکۆڵینەوەی فیکریی و ئەدەبی نما
زنجیرەی ( ٨٨ )

سەرپەرشتیکردنی پرۆژەی چاپی کتێب
ئیسماعیل کوردە، ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل

ناوی کتێب بەکوردی: ژن لە جیهانی ئەدەبی "شێرزاد حەسەن"دا
نووسەر: هاوژین حەمە ڕەشید
ژانر: لێکۆڵینەوەی ئەدەبی
پیت چنین: نوسەر
دیزاین: نما
بەرگ: ئارام عەلی
تیراژ: ٥٠٠
چاپی یەکەم: کوردستان/ هەولێر ٢٠١٠

پێشکەشە...

بە جوانترین مرۆڤ ..بەخشندەترین ژن دایکم...

بە هەموو ئەو مرۆڤە گەورمو قوربانی بەخشانەی پێیان دەڵێن بێوەژن.

## بەپێشەکی

لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی رەخنەیی کارێکی سەخت و دژوارەو هەموو کەسێك ناتوانێت بگاتە ئەو ئاستەی بتوانێت خوێندنەوە بۆ دەقی ئەدەبی بکات، چونکە رەخنەگری ئەدەبی دەبێت شارەزایی باشی هەبێت لەبارەی تیۆرو قوتابخانەو رێبازە رەخنەییەکان و بتوانێت لێکیان جیا بکاتەوە، تاوەکو بگاتە ئەو ئاستەی بتوانێت خوێندنەوەیەك بەرهەم بێنێت لەسەر روانگەی دیاریکراو وەستابێت.

هاوژین حەمەرەشید یەکێکە لەو قەڵەمە ژنانەی چەند ساڵێکە لەبواری رۆژنامەوانیدا جێی پەنجەی دیارە، چ وەکو ریپۆرتێرو چ وەکو نووسەر، بەتایبەتیش لەبواری سیاسیدا، لێرەشدا هەوڵیداوە شانسی خۆی لەبواری رەخنەی ئەدەبیدا تاقیبکاتەوە، بۆیە ئەو شرۆڤەو لێکۆڵینەوەیەی لەسەر رۆڵ و کەسایەتی و کاراکتەری ژن لەنێو رۆمان و چیرۆکەکانی شێرزاد حەسەندا نووسیوە. دیارە شێرزاد حەسەن یەکێکە لەو چیرۆکنووسانەی کورد کە رۆڵی بەرچاوی هەبووە لەپێشخستنی ئاستی رۆمان و چیرۆکی کوردیداو خوێنەرێکی بەرفراوانی هەیە لەسەرتاسەری کوردستاندا، بۆیە ئەو هەنگاوە هاوژین خۆی لەخۆیدا نازایەتی و جورئەتێکی زۆری پێوە دیارە؛ چونکە ئاسان نییە کەسێك بێت بتوانێت قسە لەسەر دەقەکانی شێرزاد حەسەن بکات.

دیارە هاوژین نەهاتۆتە نێو کێشەی رێبازە ئەدەبییەکان و خۆیشی زۆر بەوە سەرقاڵ نەکردووە کە پێرەو لەقوتابخانەیەکی رەخنەیی دەکات، ئەوەندەی لەلای ئەو گرنگ بووە لەو روانگەیە تێبگات کە تێیدا شێرزاد حەسەن تەماشای رۆڵی ئافرەت دەکات لەنێو کۆمەڵگەدا، ئەوەش لەروانگەیەکی رەخنەیی تایبەت کە ئێمە ناتوانین ناوی بنێین رەخنەی فێمێنیستی، بەڵام دەشێت هەوڵێك بێت لەو بوارەدا.

روانگەی خوێندنەوەو تێڕامانەکانی رەخنەگر زیاتر روانگەیەکی شیکاری وەسفییە، زیاتر گوزارشتکردنە لەهەندێك بۆچوونی مرۆڤانەو کۆمەڵایەتییانە، بەبێ چوونە ژێر باری زانستی رەخنەیی، ئەوەش بێگومان کارەکەی ئاسانتر کردووە، ئەگەرچی بەرهەمهێنانی دەقی رەخنەیی خۆی لەخۆیدا کارێکی سەخت و دژوارە. رەخنەگر ویستوویەتی لەو روانگەیەوە تەماشای دەقەکانی نووسەر بکات کە رەنگدانەوەیەکی پاك

و ڕەوانـی واقیعـی کۆمەڵایـەتی و کولتـووری کۆمەڵگـەی کوردیـیـە، بۆیـە دەیـەوێت دەقەکانی شێرزاد حەسەن وەکو پاساوێك بـۆ تێڕامانـەکانی خـۆی بەرانـبەر بەکۆمەڵگـە تەماشا بکات.

نازایـەتی هـاوژین لەوەدایـە هـەر زوو پێمـان دەڵێـت ئـەو بەمەبەستێکی پێشوەختە هاتۆتە نێو ئەو دەقانـە، بۆیـە پێویـست ناکـات پێمـان بڵێـت کـە گەرەکیـەتی بۆچوونە پێشوەختەکانی خۆی بەسەر ئەو دەقانەدا ساغ بکاتەوە، ئەوەش بێگومـان دەبێتـە هـۆی ڕێگرتن لەفرە بۆچوون و فـرە تێڕامـانی ڕەخنـەیی، چـونکە هـەر کاتێـك ئێمـە ویـستمان بەرگێکی دیاریکراو بەباڵای دەق ببەخشین، ئەوە ڕێگای لێدەگرین بەشێوەی تـرو جیـاواز گوزارشـت لـەخۆی بکـات، بـەڵام بـا ئـەوەمان بـیر نەچـێت پاسـاوەکەی ڕەخنـەگر ماقوڵییەتێکی زۆری تێدایە، لەبەرئەوەی جەخت دەکاتە سەر یەك لایەنی ئەو چیرۆکانەو قسە لەبارەی تەکنیك و شێوازی گێڕانەوەو کرێچن و دەسپێك و ڕەوانبێـژی ناکـات وەکـو ئەوەی ڕەخنەی نوێ زۆر کاری لەسەر دەکات و خۆی پێیەوە ماندوو دەکات. نەخێر، ئـەو هاتووە لەڕوانگەیەکی بچووکەوە دەڕوانێتە دونیایەکی فراوانی شێرزاد حەسـەن کـە ژنـەو لـەو زەمانـە دەکۆڵێتـەوە کـە پـڕە لەنێرایـەتی، بـەڵام ڕاڤـەکردنی ئـەو زەمانـە نێرینەیـە لەمیانەی گۆشەنیگای سێکس و ژن و کێشە کۆمەڵایەتییەکانی کە ڕوو بەڕووی ئافرەتان دەبێتەوە لەنێو کۆمەڵگەی کوردیدا.

لەپەنجەی دەست تێناپـەڕن ئـەو قەڵەمـە ژنانـەی کـورد کـە دەتـوانن کـاری ڕەخنـەیی بەرهەم بێـنن، ڕەنگـە هـاوژین حەمەڕەشـید بتوانێـت لـەداهاتوودا بێتـە نێـو ئـەو کایـە سەختە، بەمەرجێك بتوانێت لەدەرەوەی تێڕامانی باو، بەمیتۆدی ڕەخنەیی نوێوە، کـاری نوێتر بەرهەم بێنێت.

ڕێبین ڕەسوڵ ئیسماعیل
هەولێر ـ ٢٠١٠/٣/٢١

**دەستپێك**

بە هەموو پێوەدانگەکان ئەگەر بمانەوێت لە کێشەو پرسەکانی هەر کۆمەڵگەیەك بدوێین، دەبێت زۆر بە قوڵی رۆچووبینە ناو ئەدەبیاتی ئەو کۆمەڵگەیەو ئەدەبەکەیان بە وردی خوێندبێتەوە، وەك چۆن ناسینی گەلێك بێ ئەدەب و فەرهەنگێکی تایبەت بەو گەلە دەبێتە پرۆسەیەکی ئاڵۆز، بەهەمان شێوە کە لە کێشەو پرسی ژنان وەك پرسێکی ناو کۆمەڵگە دەدوێین، دەبێت بگەڕێینەوە پەراوێزی رووداوەکان و وێنەی رووداوو دیاردەکان لە ناو دەق و تێکستە ئەدەبییەکاندا. لە خوێندنەوەی ئەم دەقانەشەوەیە کە بە واقیع و ناخی کۆمەڵ و کۆمەڵگەو شتە زۆر پەنهانی و شارەوەکان ئاشنا دەبین و دەتوانین بەرگی هەموو ئەو دەمامکانە دابماڵین کە بە رووخساری کۆمەڵگەوەن.

وەك شێرزاد حەسەنی چیرۆك نووس دەڵێت" **ئەدیب لە خۆیی ودواتر لە خێزانەکەیەوە دەست پێ دەکات، پاشان رووەوکۆڵان وگەڕەك و شاروشارۆچکەو گوندو وڵاتەکەی دەڕوات، ئینجا دەکرێت رووەو جیهان بکشێت وهەموو کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بەهی خۆی بزانێت و وێنایی رۆح لە شێوەو دەرکەوتنی جیاوازدا بکات".**

بۆ نموونە من ئەمڕۆ شێرزاد حەسەن بە شکڵ دەبینم، کەچی زەمەنێکە رەسمی ناخی ئەوم کێشاوە، ئێستا لە ناخی ئەو دەدوێم لە ناخی خۆم، ناخی کچانی کۆڵان و گەڕەك وکچانی ئەم شارەو کچانی کۆمەڵگەی کوردی دەدوێم. چییە وایکردووە منێك بە ناخی شێرزاد حەسەن بەم شێوەیە ئاشنا بم بێ ئەوەی رووخساریم بینیبێت، گەر ئەدەبەکەی نەبێت، رەنگە ئەمە بۆ من هەندێك قورس بووبێت ، قورسیش بێت بێم لە دەقە ئەدەبییەکانی شێرزاد حەسەنێك وەك ئەدیبێك بدوێم. کاری منیش نەبێت لە زمان و فۆرمی بەرهەمەکانی ئەدیبێك بکۆڵمەوە، ئەمەش بەو خوێندنەوەیەی کەمن ئەدیب نیم، بەڵام کاتێك من ئافرەت بم لە خوێندنەوەی بەرهەمە ئەدەبییەکانی ئەدیبێکەوە وێنەو رەسمی رۆحی خۆم ببینم، دەبێت وەك سیمۆن دیبڤوار دەڵێت: لەخۆم بپرسم" **ئەوە پیاوە رەسمی رۆحی منی کێشاوەو منی بەمێ کردووە، من خۆم نەبووم کە خۆم بە مێ کرد" .**

ئایا رەگەزێك دەتوانێت وێنەی ناخی رەگەزێکی دی وەك خودی ناخی ئەو رەگەزە بکات کە لە رەگەزی ئەو نییە. دیارە ئەم پرسارە وەلاّم و خوێندنەوەی دەوێت، درووست بوونی ئەم پرسیارەش بوو لە هزرمدا خستمییە سەر کەڵکەڵەی ئەو بیرۆکەیەی کە بە پەنهانیی دەقە ئەدەبییەکانی ئەدیبێکی وەك" **شێرزاد حەسەن** "دا رۆبچم و خوێندنەوەی دەقە ئەدەبییەکانی ئەو وەك نموونەیەك لە تێکستی ئەدەبی هاوچەرخی کوردی و وێناکردنی رۆحی تاکی مێینە تێیدا وەربگرم . کە لەکۆی بەرهەمەکانیدا ئەم رەسمکردنە بوونی هەیەو دەبینرێت.

## زمانێکی پڕاوپڕ نێرانە

وابزانم کاتی ئەوە هاتووە....گەر ژنان خۆیان رەسمی ناخی خۆیان لە ناو تێکستە ئەدەبییەکاندا نەکێشن، نەتوانن راڤەی ئەو زمانە بکەن کەدەقی ئەدەبی کوردی بەرهەمهێناوە. کە زمانێکی پڕاوپڕ نێرانەیە. دیارە ئەوەش لە نەبوون و ناثامادەیی دەقێکی ئەدەبییە لە دەرەوەی ئەو زمان و دەربڕینە نێرانەیەی کە مۆنۆپۆلی سەرجەم چەمك وکایەو واتاو فۆرم و جیهانبینی وخودبینی ناو دەقی ئەدەبی کوردی کردووە . هەروەها لە ناثامادەیی دەقێکی ئەدەبییە بەناوی دەقی ئەدەبی مێینە لە ئەدەبی کوردیدا... بەرامبەر بەوە ئامادەیی هەمیشەی ئافرەت وەك رەمز و کەرەستە و کاراکتەری سەرەکیی لە دەقی ئەدەبی کوردی کە بۆ خۆی دەبێت جێی پرسیار بێت لای تاکی مێینە و لە خوێندنەوەی تێکستی ئەدەبی کلاسیکییەوە بۆ ئەدەبی نوێ خودی ئافرەت بزانێت لە پشت ئەو هەموو ئامادەبوونانەی جەستە و رۆحی ئەوەوە، ئایا شتێك بەناوی حەقیقەتی ناخی ژنی کورد بوونی هەیە. ئایا دەقێکی ئەدەبی نوێ هەیە کە بەزمان و بیری پیاو بەرهەم هاتبێت و رەنگدانەوەی واقعی ناخی مێینەی کوردو شتە زۆر پەنهانییەکانی جیهانی مێینەی ئەو بێت بەبیرێکی نوێخوازانە و مرۆڤ بینیانەوە. ئەو دەقە ئەدەبییە بەناخی کێشەو پرسەکانیدا دوور لە هەموو گومانەکان رۆچوو بێت، لەخوێندنەوەو وەرگرتنی دەقە ئەدەبییەکانی شێرزاد حەسەنی چیرۆك نووس وەك نموونەیەك لە ئەدەبی هاوچەرخی کوردی ، ئەو دەقە ئەدەبییانەی کە لە خوێندنەوەی هەریەکەیان وێنەیەکی جیا لە ناخی خۆمانی تێدا دەبینین. ئێمە هەم رەمز و هەم کەرەستە و هەم کاراکتەری بۆ هەمیشە ئامادەیین

تێیاندا و بەزمانی گێڕانەوە لەسەر زاری نووسەردەوە لە ناخی خۆمان دەدوێین... بەپێی ئەم خوێندنەوەیەش بۆ ئەو بەرهەمانەی نووسەرکە بۆ ئەم بابەتە هەڵمبژاردوون، قسەیان لەسەر دەکەم، بە کۆمەڵێك لەو دەرئەنجامانە دەگەین کە مەبەست و ئامانجی سەرەکی ئەم خوێندنەوەیەن وەك لە سەرەتای بابەتەکەدا ئاماژەم پێداوون، هەرچەندە ڕەنگە باسەکەمان باسێکی تەواو کامڵ نەبێت بەو شێوەیە نەبێت کە بڵێین هەقی خۆیمان تەواو پێ داوە. چونکە هەریەکە لەو دەقە ئەدەبییانە بۆ خۆیان بابەتی باسێکی تەواون گەر بمانەوێت بە وردی خوێندنەوە بۆ هەموو واتاو چەمك ولایەنە پەنهانییەکانیان بکەین.

بەهەرحاڵ ئەو بەرهەمانەی من تێبینی و بۆچوونەکانم لەم باسەدا لەسەر گەلاڵە کردووە، ئەم بەرهەمانەن **"گوڵی ڕەش(چیرۆك)، پێدەشتی کار مامزە کوژراوەکان( ڕۆمان)، خەونی جاڵجاڵۆکەکان(نۆڤلێت)، حەسارو سەگەکانی باوکم(ڕۆمان)، تەمی سەرخەرەند(ڕۆمان)"** ،کە دووایین ڕۆمان و بەرهەمی نوێی نووسەرە. بێ لەوەش من نامەوێت لەو فەلسەفە و بیر و تیۆرییانە بدوێم، کە نووسەر لە چوارچێوەی بەرهەمەکانییەوە دەیەوێت بەخوێنەری بگەیەنێت و خوێنەری پێ ئاشنا بکات، بەڵام ئەوەی کە من لێی تێ دەگەم ئەو بیرە نوێخوازییە، کە لای نووسەر بەرامبەر بە دیاردەو واتاو چەمك و شتەکان بوونی هەیە، بەپێچەوانەی ئەدەبی کلاسیك و زۆر لە نووسەرانی سەردەمی خۆی کە ڕوئیایەکی تەواو داخراویان لە مەسەلەی جیهانبینی بۆ شتەکان بەچەمکی نوێخوازی هەیە. ڕەنگە ئەوەش ڕەنگدانەرەی کاریگەری و نزیکی نووسەر بێت لە ئەدەبی ئینگلیزی، کە نووسەر بەهۆیەوە توانیبێتی خۆی لەلایەنە هەرە شاراوە و نهێنییەکان و تاریکاییەکانی ناخی کۆمەڵگەیەك لە ئاوەژووکردنی ناخی خۆی بدات. بەتایبەت لە مەسەلەی پرسەکانی ژن و تێڕوانینی بۆ ژنانی کۆمەڵگەکەی، کە پانتاییەکی فراوانن لە دەقە ئەدەبییەکانیدا بەشێوە و دەرخستەی جیا. ئەوەی من کردوومە خوێندنەوەیە بۆ ئەو بەرهەمە ئەدەبیانەی نووسەر کە ئاماژەیان پێکراوە، ئەمەش لە سێ تەوەر و چەمکی جیادا کە لە هەر سێکیاندا ئافرەت وجودی هەیە، هەر بۆیە باسەکەش کراوە بەسێ تەوەرو بەشی سەرەکی.

## تەوەری یەکەم: ئافرەت و ئەویینداری... خۆشەویستی

چەمکی خۆشەویستی و ئەوین وەك چۆن مەبەستی سەرەکی زۆرینەی بەندو دەقە فۆلکلۆری و میللی و نووسراوەکانی قۆناغی کلاسیك و رۆمانتیك و ریالیزم و ئەدەبی هاوچەرخی کوردین، کە دەشێت لە کۆی دەقە ئەدەبییەکانی هەریەك لەم قۆناغانە ئەگەر بکرێن بەچوار بەشەوە سێ بەشی رووبەری بەرهەمە ئەدەبییەکان بێت... جا ئەدیب مەبەستی لەو خۆشەویستییە خۆشەویستی نیشتمان، نەتەوە، یەزدان... تەصەوف... جوانی سروشت... یاخود خۆشەویستی بەواتای پەیوەندییەکی رۆحی قووڵ لە نێوان دوو رەگەز کە نێرینە و مێینەن،کەلە زۆربەی حاڵەتەکاندا هەموو خۆشەویستییەکان تێکهەڵکێشی ئەو خۆشەویستییە رۆحییە کراون ولەبەرگی ئەودا بەردەوام وێناو دووبارە دەکرێنەوە، کە لە نێوان هەردوو رەگەزەکەدا بوونی هەیەو تاژیان بەردەوام بێت ئەویش وەك یەك لە پرۆسە ژیارییە ئەمرەکان بەردەوامە، بەهەمان شێوە لای دەقە ئەدەبییەکانی شێرزاد حەسەن ئەو جۆرە خۆشەویستی و ئەوینە بەردەوام خۆی دووبارە دەکاتەوە، کە پەیوەندییەکی قووڵی رۆحی نێوان مێینەو نێرینەیە. وەك ئەو عەشق و ئەوینەی لە هەریەك لە داستانی مەم وزین و شیرین وفەرهاد ورۆمیۆو جۆلێت و دەیان رۆمان و داستان وئەفسانەی خۆشەویستیدا هەیە.

لێرەدا پرسیارێك کە دەکرێت بکرێت ئەوەیە" **ئایا پەیوەست بوونی ئافرەت لەو پەیوەندییە بە چ وێنەیەکە...ئایا هەمان ئەو وێنەیەیە کە لە ئەدەبی کلاسیکدا رەنگی داوەتەوە؟".**

مـن لـەم دێـڕەوە دەسـت پـێ دەکـەم **"پێشکەشە بە کەژاڵ... بۆ مانەوەی جوانییەکانی ئەڤین تا ئەبەد"**، دیارە کە کەژاڵ لە پێشکەشکردنی رۆمانێکی وەك **"پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکان"** دەکرێتە رەمزێك بۆ مانەوە و بەردەوامی جوانییەکان بەو ئاماژە پێدانەیە کە کەژاڵ رەمزێك بێت بۆ تەواوی رەگەزی مێینە کە رەمزن بۆ مانەوەی جوانییەکانی ئەوین... وەك "**مردنی گوڵەکان، گوڵە مۆرەکان بە ونبوونی هێرۆ لە چیرۆکی گوڵی رەش لای حەمەی ئەویینداری، مردنی ریشۆڵەکان بە ونبوونی هەمین لە پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکان لای دەروێش بایز، مردنی**

بزنه شین كـه وێنـەی شـیرینی خۆشەویـستە لای فـەرهاد لـە ڕۆمـانی تـەمی سـەر خەرەندا".

بەڵام ئاخۆ ژنان تەنیا ڕەمزێكن بۆ مانەوەی جوانییەكانی ئەوین یاخود ئەوەیە كـە پێكهاتەیەكی سەرەكی پرۆسەكەن؟، یان وەك باسمان كـرد وەسـیلەیەكە بـۆ گەیانـدنی چەند مەبەستێكی نووسەر، چونكە ئەوەی لە خوێندنـەوەی بەرهەمـەكان تێیدەگـەین شـتێكی تـرە بـۆ نموونـە: **لەهـەردوو چـیرۆكی گـوڵی ڕەش و ڕەنگاڵـە هەریـەك لـە خۆشەویستەكان هێرۆی خۆشەویستی حەمە لە گوڵی ڕەش و مریەمی خۆشەویستی حەسەن لەڕەنگاڵە** لەگەڵ ئەوەی حەمە و حەسـەن بـەزمانی خۆشەویـستی لەگـەڵیان دەدوێ، بـەڵام وا هەسـت دەكرێـت وەسـیلەیەك بـن بـۆ فەلـسەفەی سـستمێكی كۆمەڵایەتی كە ئەویش سستمی چینایەتی – چینی بـۆرژوا و سـەرمایەدار و چـینی هـەژارو ئـەو ململانێیەیـە كـە لـە نێوانیانـدا هەیـە كـە هۆكـارێكن بـۆ سـتەمێكی چینایەتی كە لە نێوانیاندا تاكەكان دەبنە قوربانی...

بەتایبەت لە كاتێكدا بەزمانی گوڵی حەمـە كـە لەگـەڵ هێـرۆ بەخـەیاڵ دەدوێـت، بەهەمان شێوە حەسەن لەگەڵ مریەم لـەو دەمـەی ون دەبـن و لـە هـەواڵیان نـازانن، لەهەمان كاتدا حەسەن دەڵێت **"مریەم زەوتیان كردی بۆیان كرا"** كە دەشڵێین بوونـە قوربـانی تاكـەكان لەسـایەی فەلـسەفەی ئـەو سیـستەمەی كـە نووسـەر دەیـەوێت بەدەقەكانی لێیان بدوێت لە دانپێدانانی نووسەر دایە بەهۆكاری ونبوون و دیارنەمانی خۆشەویـست كـە لێیـەوە دەیـەوێت ئامـاژە بـەوە بـدات كـە ئەمـە بـێ وەفـایی خۆشەویستەكان نەبوون وەك تاكی مێینە، بەڵكو تاوانی ئەو سیستەمە كۆمەڵایەتییـە چەوتە بووە، كە سیستمێكی چینایەتییە. وەك لە ل١٣٥ دا **لـە چـیرۆكی ڕەنگاڵـە، حەسەن بە مریەم دەڵێت: "مریەم لێت خۆش دەبم، چـونكە تـۆ وەك مـن لەیاسـای چەوت و نارێكی ئەوان تێ ناگەی..." هەروەها گـوڵی ڕەش كـە حەمـە بـە هێـرۆ دەڵێت: "هێرۆ گیان چی وای لێكردی خۆت بەند بكەی؟ تۆش وەك زۆربەی كچانی ئەم وڵاتە نەخۆشیت حەز دەكەی ئازارم بدەیت".**

لێرەدایە كە بێگومان دەبین لـەوەی كـە هۆیـەكی دی هەیـە بـۆ دوور كەوتنـەوە و جێهێشتنی خۆشەویست یان ئەوەی كە هێرۆ بە ئافرەتێكی ماشۆس دەچـوێنێت واتـا

ئـافرەتێكی چەوسـاوە كـە دەیـەوێت لـەپای چەوسـاندنەوەی خـۆی كەسـێكی دی بچەوسێنێتەوە بەئەشكەنجەدانی رۆح.

دووەم: بەهەمان شێوە لە چیرۆكی **"میم" لـەپاڵ نـاوی "گوڵنـاز" كـە هاوسـەرو خۆشەویستی ئەمینە** نووسەر تیۆرییەك دەخاتەڕوو كە تیۆری موڵكایەتی تایبەتە بە فەلسەفەی ئینگلیز لە كتێبی **"خێزان و موڵكایەتی تایبەت"**، جگە لە خۆشویستن كە تاكی مێینە پێش جیابوونەوە و دوای جیابوونەوە دەكاتە مـوڵكی پیـاو كـە بـۆی نییە لەدەرەوەی ئەو سنورە هیچ مومارەسەیەكی ژیان بكات... هەتا لەو دەمەی كە توانا غەریزەییەكانی بەرامبەری پەكیان دەكەوێت... دەبێت ئەویش دەست لـە ژیـان بەربـدات.بـەڵام بـە پێـچەوانەوە رەگـەزی بەرامبـەر بـە كۆتـایی هـاتنی توانـا غەریزەییەكانی رەگـەزی بەرامبـەری بـەردەوام دەبێـت لـە ژیـان وسـەرلەنوێ لەگـەڵ كەسێكی تر لەرەگەزی بەرامبەری مومارەسەی ژیان وەك پێشتر دەكات.ئەمەش ئەو واقعەی كۆمەڵگەو پرۆسەكانی ژیانە كە نووسەر لە دەقە ئەدەبییەكانیـدا بـێ پـەردە دەیانخاتە روو.

**سێیەم:** شوێنی خەرەند لەپرۆسەی خۆشەویستی لەكلتووری شارۆچكەی رەواندوز و سنووری جوگرافی خەرەندە كە بە كوشتن كۆتایی بە پەیوەنـدیی خۆشەویستی نێـوان دوو ئەویندار لە قەدەری شوێن دێت.. **لەتەمی سەر خەرەند لە فڕێدانە ناو خەرەندی خوشكەكەی شیرین لەلایەن باوكی كاتێك مومارەسەی خۆشەویستی دەكات.** پاشان نادیاری **چارەنووسی شیرین و بەستنەوەی بەچارەنووسی بزنە شێتە كە هەڵەتە دەبێ و دوای بەهەلا هەلابوونی لەناو خەرەند كۆتایی دێت...** بەئاشكرا دیارنەمانی شیرین شوێنی خەرەندە لە دەركەوتنی تارمایی شیرین و دوای دوورخستنەوەی لـە فـەرهاد، كە بۆخۆی رەنگدانـەوەی ئـەو فەلسـەفەیەیە كـە سیـستمی دەسـەڵاتی بـاوك بەسـەر فەرزەندەكاندا دەیسەپێنێت بەو جۆرەی كە لـە**"حەسـارو سـەگەكانی بـاوكم "**یـشدا دەبینرێت، كـە فەرزەندەیـەكی ملكـەچ و ترسـنۆك و خەسـیو زیـاتر لـە نێوحەسـاری باوكدا جێی نابێتەوە، چـونكە لـەو دەمـەی چارەنووسـی شـیرین بـە مـردن و كوشـتن لەخەرەند كۆتایی دێت چارەنووسی فەرهادیش لەو باشتر نییە و دوورخستنەوەو كۆچە كەدوای گەڕانەوە دەبێتە كەسێكی نامۆ بەشوێن و شار.

روویەکی دی خوێندنەوەکان بۆ خۆشەویستی ئەو بنەمایەیە کە لە ئەدەبیاتی کلاسیکیدا بە گشتی و ئەدەبیاتی کلاسیکی کوردی بە تایبەتی دەبینرێت، کە تێیدا تەنیا رەمزی بەوەفایی و فیداکاری و قوربانیدان پیاوە هەر وەك نووسەری ئێرانی **"بووزرگی عەلەوی"** لەهەردوو رۆمانەکەی **"چاوەکان"** و **"سەمای مەرگ"** ئەو بنەمایە پووچەڵ دەکاتەوە.

بەوەی کە لەئەدەبی هاوچەرخدا دەکرێت ئافرەتیش قوربانیدەر و رەمزی وەفاو فیداکاری بێت، لەپێناو ئەوینێکی ئەبەدیدا ریگای سەخت و دژوار هەڵبژێریت. واش بووە ئەگەر بەدیدێکی واقعبینی و دوور لەلاگیری جیاکاری رەگەزی لەشتەکان بدوێین بەتایبەت لەمەسەلەی خۆشەویستی رەگەزی مێینە هەمیشە قوربانی سەرەکی بووە، کەچی لەئەدەبدا بەهەموو شێوەیەك لەو رەمزە رووت کراوەتەوە و بۆتە رەمزی بێ وەفایی... کەئەمەش وادەکات ئەمرۆ تاکی مێینە بەرامبەر بەو دەق و تێکستانە کە تێیدا کراوەتە کەرەستەیەکی جوانکاری و دامرکاندنەوەی حەزە غەریزەییە چەپێنراوەکانی رەگەزی بەرامبەر لە کۆمەڵگەیەکی چەپێنراوی داخراوی پیاوسالارو باوکسالاردا بەتەواوی بخاتە گومانێکی قووڵەوە، کەرەگەزی مێ تێیدا لە کۆی بەها مرۆییەکانی و لە پرۆسە ژیارییەکاندا بەتاڵکراوەتەوە، گەرچی لە کۆی هەموویاندا کاراکتەری سەرەکییە، بەڵام وەك تاکێك خودی ئەو دەرکراوەتە دەرەوە. بزورگی عەلەوی لە ئەدەبی هاوچەرخی فارسدا ئەم رەمزە**"ژنان"** لە واقعی رووداوەکانەوە وێنا دەکات و دەیانکاتەوە کاراکتەری قوربانیبەخشی ناو پرۆسەکە ، ئەمەش بە قوربانیدانی هەردوو کیژە عاشقی کچە پاڵەوانی دوو رۆمانەکەی **"فەرەنگیس و مارگرێتا"** لەپرۆسەی عەشقدا. بەهەمان شێوە دەتوانین لە رۆمانی **"کارمامزە کوژراوەکان"** کچە پاڵەوانی رۆمانەکە لە پرۆسەی عەشقدا بە قوربانیدەر ببینین کە رێگایەکی سەخت هەڵدەبژێریت... قوربانییەکەش هەڵگەڕانەوە و هەرەتەبوونە دواتر ونبوونە لەناو پرۆسەیەکی نادیاردا... کە **"بەردەوام لە پێناو مانەوەی ئەویندا دەجەنگێت بەتایبەتی لەو دەمەی دەروێش بایز لەسەر خەوێکدا خۆی بە ونبوو دەبینێت و هەمین بەدوایدا دەگەڕێت و لە ریشۆڵەکان دەپارێتەوە لە گوناحی خۆش بن و دوایی لێیان دەپرسێت ئەگەر لەهەر کوێ هەمینتان بینی پێم بڵێن.**

**دووەم:** دەروێش بایز لەوکاتەی دەکەوێتە گومانەوە هەر زوو گومانەکەی بەوە پووچەڵ دەکاتەوە کە هەمین لەناو ئاغاو کوێخا و پیاوانیدا ئەوی هەڵبژاردو خزی لە براو باوکی کرد...لەو دەمەش کە دەیەوێت خۆی بەئادەم بچوێنێت پەشیمان دەبێتەوە و لە یەزدان دەپاڕێتەوە کە ئەو گوناهێکی نەکردووە هەمین نافرەتێکی سادەو پاك بووە عاشقێکی جوانی ئەو و هەمینی کلۆڵ لەدوو کەسی کلۆڵ و مەینەتبار چیتر نین.

**سێیەم:** لە چیرۆکی **"میم"** دا کاتێك ئەمین وای لێکدەداتەوە کە گوڵناز بێ وەفا بوو دوای لەپیاوەتی کەوتن فەرامۆشی کردووە کەچی هەرخۆی بەشێوەی گێڕانەوە دەڵێت "پێش ئەوەی جیابێتەوە گوڵناز گوتی: **"ئەمین نەڵێیت پەکم کەوتووە بۆیە جێم دێڵێ... من بۆ ئەوە جێت ناهێڵم، بەڵکو لە گومانە زۆرەکانت و پرسیارەکانت لە کوێ بوویت بۆ کوێ دەچیت کەی دێیتەوە... دڵمت کرمێ کردووە"**. هەروەها لە نیشاندانی وێنەی راوکردنی کارمامزەکان لە **"پێدەشتی کارمامزەکوژراوەکاندا"** لەلایەن ئاغاو راوچیەکانی کە دەیان کارمامزی وەك هەمینن ئاماژەی راستەوخۆن بۆ بەقوربانی بوونی تاکی مێینە لە پرۆسەی خۆشەویستی لە سایەی سیستمی دەرەبەگایەتی و کلتوری دەستەلاتی ئاغاو دەرەبەگدا و لە چوارچێوەی سیستمی باوکسالاریدا، کە بە کوشتنی ژنان لە کاتی مومارەسەکردنی پرۆسەی خۆشەوستی کۆتایی بە پرۆسەکە دێت، بۆ نموونە باسکردنی کوشتنی خانزاد لەناو زەلکاوەکە لە چیرۆکی **"زەلکاو"** و لە هۆکارەکانی ونبوونی هێرۆ لە چیرۆکی **"گوڵی ڕەش"** و مریەم لە چیرۆکی **"رەنگاڵە"**.

لە هەریەك لەم بەرهەمە ئەدەبیانەی نووسەردا هەمووی خستنەرووی واقعی ئەو ستەمە کۆمەڵایەتییەن کە لە تاکی مێینە لە سایەی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەی کۆمەڵگە بەڕێوە دەبات لە پرۆسەکانی ژیاندا دەکرێت بە تایبەت لە پرۆسەی خۆشەویستی کە ژن بە هەموو شێوەیەك بۆی نییە مومارەسەی بکات، ئەگەریش مومارەسەی بکات ئەوا چارەنووسی بە چارەنووسی هەمین و مریەم و خانزادو خوشکەکەی شیرین لە رۆمانی تەمی سەرخەرەند دەچێت.

هەموکوڕو کچە خەسیو چەپێنراوەکانی ناو رۆمانی **"حەساروسەگەکانی باوکم"**ی نووسەردا بەگژا چوونی ئەسپ وسەگ وپشیلەو زیوان وگومەز هەموی

ڕەنگدانەوەی واقعی ئەو سیستمە کۆمەڵایەتییەیە باوك سالارەیە کە تا ئێستا کۆمەڵگەی کوردی و زۆر لە کۆمەڵگەکانی مرۆڤایەتی بەڕێوە دەبات. "هەستکردنی تاوانی کوشتنی باوك لە هەمان ڕۆمانی حەسار و سەگەکانی باوکم لەپەنای فریودانی کوڕ لەلایەن باوەژن و ژنە بچووکی باوك و تاوانبارکردنی ڕەگەزی مێینە لە ڕوخانی حەسار و باوك کوشتن بەپیلانی باوەژن و ڕەدووکەوتنی باوەژن لەگەڵ باخەوانی حەسار... هەستکردنی کوڕ بەگوناحی تاوانی باوك کوشتن دوای فریودانی باوەژن بەوەی کە یەزدان لەم تاوانەی خۆش نابێت و دەبێت تا هەتایە بەو گوناحەوە بتلێتەوە هەمان ڕەسمی ئەفسانەی ئادەم و حەوایە لای نووسەر دووبارە دەبێتەوە، کە تەواو پێچەوانەی ئەوەیە کە لە ڕۆمانی کارمامزەکوژراوەکاندا لە هەمیندا بەرجەستە دەبێت. **پرسیاریش ئەوەیە ئایا بۆ نووسەر ناخی بەم جۆرە ئاوەژوو دەبێتەوە، ئایا ئەمەش لەپەنای ڕەنگدانەوەو بەردەوامی هەمان سیستمی کۆمەڵایەتییە کە لە کۆی بەرهەمەکانیدا بوونی هەیە ؟**

## تەوەری دووەم: ژن و سێکس

ڕۆچوونی شێرزاد حەسەن بەناو پەیوەندییەکانی نێر و مێ لەوخاڵە ناوەستێ کە تەنیا پەیوەندییەکی سادەو و لاوەکی بێت،بەڵکو ئەو بابەتیانەو زۆر بەقوڵی بە ناو پەیوەندییە زۆر پەنهانییەکانی هەردوو ڕەگەزدا ڕۆدەچێت، بەو شێوەیەی کە لە نۆڤلێتی **"خەونی جاڵجاڵۆکەکان"** دا دەیبینین، کە بەرلەوەی لەزمانی خەونەوە لە جووتبونی جۆرێك لە جاڵجاڵۆکە بەناوی **"ئەرکینیا"** بدوێت و وێنەی خۆی و پاکیزی هاوسەری لە ڕەسمی ئەو جۆرە جاڵجاڵۆکەیە لە حاڵەتی جووتبوون ببینێت... باس لەوە دەکات کە ئەو هەر لە منداڵییەوە خولیای ئەوە بووە کە لە نهێنی شێوەی جووتبوونی نێوان هەموو گیاندار و هەتا باڵندە و مێرووەکانیش بزانێت.کە پێموایە قسەکردنی نووسەر بەم جۆرە لە بەرهەمێکی ئەدەبیدا کە دەرگا لەسەر شتە تابۆکراوەکانی مێینە وەك تاکێکی کۆمەڵگەی کوردی دەکاتەوە،کە تێیدا باسکردن لە جووتبوون هەتا لە نێوان ژن و مێردەکانیشدا تابۆو شەرم و قەدەغەیە،کە نووسەر بەمە دەیەوێت ئەو واقعە تاڵە بخاتە ڕوو کە تاکی کۆمەڵگەی کوردی گیرۆدەیەتی

وبەهــەموو شــێوەیەك تــاكێكی خەســێنراو چــەپێنراوە لــە راستیــشدا ئــەوەی لەبەرهەمەكانیـدا ئامـادەیی بـەردەوامی هەیـە و رووبـەرێكی فراوانــی لــە دەقــە ئەدەبییەكانی نووسـەرگرتووە پەیوەنـدیی زایەنـدی نێـوان نێـر و مـێ و سێكـسە بـە شـێوەیەكی گـشتی، وەك چـۆن لـە واقعـی كۆمەڵگـەدا هـەموو قورسـای ژیـان و پرۆسەكانی لەسـەر سـێكس كۆكراوەتـەوە. هـەر لـەم بارەیـەوە نووسـەر لـە وەڵامـی پرسیارێكدا كە لێـی دەكرێـت دەڵێـت" **هونـەر و ئـەدەبی كـۆن و نـوێ، سـێكس و پەیوەندییەكانی نێر و مێی لێدەركە هیچی تێدا نامێنێتەوە"**. بە هەمان شـێوەش لە راستیدا ئەم چەمكە پانتاییەكی گەورەی لە فیكـرو فەلـسەفەو دەقـە ئایینیـەكان داگیر كردووە.

**راستە شێرزاد حەسەن وەڵامی ئەوەی بەوە داوەتەوە و پرسیاری ئەوە دەكات ئایا دەكرێت نێر و مێ لەناو رۆمان و چیرۆك و شـانۆگەرییەكان دەربكـەین، كـە ئـەوە وادەگەیەنێت لەناو ژیانیش دەریان بكەین...** چونكە ئەدەب و ژیان لەیەكـدی قـەرز دەكەن. بەڵام ئایا خۆدان لـەو هەرێمـە حـەرامكراوە بـەو شـێوەیە كـە لـە ئـەدەب و كلتوری ئێمەدا قسەی لەسەر كراوە و ژنی پێ لەواتا ئینسانیەكەی رووت كراوەتەوە، شەهامەت و هێزی پیاوی لەپەناوە پێ بەرزتر كراوەتەوە، بۆ چەپاندن و چێژ وەرگرتن و دامركانەوەی حەزە غەریزەییەكانی نێرینەیە لـە سـنورێكی مـێ رێـژكراودا یـاخود پەردە هەڵماڵینە لەسەر ئەو غەریزەیەو توانا غەریزەیی و حـەزە غەریزەییەكانـە لای خودی تاكی مێینە كە بۆ خۆی لێی دەركراوە. بۆ نموونە لـە خـەونی جاڵجاڵۆكەكانـدا بە پاكیزە دەڵێت: **"هەندێكیان تابڵێی دڕندەن، ئەو وەختەی تێكدەئاڵێن لەگەرمەی رامووسان و دەست لە ملانێدان مێیەكە نێرەكەی دەخوات"**... پاكیزە تووڕە دەبێت دەڵێت **"هەموویان نا هەندێكیان كە بە بێوەژن ناسراون"**. لێـرەدا مـن وای دەبیـنم شێرزاد حەسەن لە گێڕانەوەی خەونەكە و پێش خەونەكەش مەبەستی تـەنیا مێینـەی ئەو جاڵجالۆكە نەبێت... كە ئەوەندە توانا غەریزەیی و ئارەزوو حەزە غەریزەییەكانی بەهێزە لە كاتی جووتبوون نێرینەی جاڵجاڵۆكەكە دەخوات، بەڵكو مەبەستی ژن بێت بەتایبەت ئەو ژنەی كـە پێـی دەڵـێن بێـوەژن و دوای بێـوەژن كـەوتن بـەپێی حـوكمی كۆمەڵگـە توانـا و ئـارەزووە غەریزەییـەكانی دەبێـت بمرێـت.كـە بۆخۆشـی پێمـوایـە خستنەرووی مەینەتییەكانی بێوەژن و دەركردنە دەرەوەیەتی لە مومارەسـەكردنەوەی

توانا زایەندییەکانی، کە لە ناو خودی خۆیدا هێندە تامەزرۆی جووت بوون دەبێت،گەر بێت و رێی پێبدرێ لە راموسان و بەتاڵکردنەوەی حەزە سێکسییەکانی کە کۆمەڵگە لێی تابۆ کردووە رەگەزی بەرامبەر قوت دەدات. چونکە سروشتی مرۆڤ وایە کە پێویستی بە خۆبەتاڵکردنەوەی بەردەوامی پاڵنەرە سێکسییەکان هەیە بێ جیاوازی جەندەری، کە ئەمە لە کۆمەڵگەی ئێمەدا گەورەترین گوناح و حەرام و تابۆیە بۆ تاکی مێینە بە تایبەت ئەو تاکە مێینەیەی کە پێی دەگوترێت بێوەژن .کە دوای بێوەژن کەوتن دەبێت دەست لە خۆیی و لەژیان بشوات، دەیان نموونەش لە کۆمەڵگەی کوردیدا دەبینرێت کە هەتا زۆرجار حاڵەتی کوشتن لەناو ئەم چینەی ژناندا هەبووەو دەبینرێت،کە لە بێوەژنێك ئاشکرا بوو بێت پەیوەندییەکی خۆشەویستیشی هەبوو بێت هەتا بە گومانیش بوو بێت رووبەرووی مەرگ و کوشتن بۆتەوە لە لایەن پیاوانی بنەماڵەکەیەوە.

دووەم: کە پاکیزە دەبێتە جاڵجاڵۆکەیەکی گەرۆنە پەردەیەکی بۆ دەچێنێت و هەموو جاڵجاڵۆکەکانی دی کە دێن بەدەوری پەرژینەکە دەیانکوژێت... بەرامبەر بەوە وەسفکردنێکی ناشرینی ئەو بۆ پاکیزی جاڵجاڵۆکە.

بەخوێندنەوەی من ئەوە نییە کە ئەو مێینەیە ئیرەیی بەو دەبات، بەڵکو پێچەوانەی ئەو هاوکێشەیەیە کە نێرینە لە پەیوەندی نێوان نێرو مێ پەیڕەوی کردووەو ژنی کردۆتە موڵکی خۆی و پەرژینیکی بەدەوردا کێشاوە، بەو جۆرەی کە دەبێت هەموو حەزو غەریزەو پاڵنەرو توانا سێکسییەکانی لەژێر رکێف و فەرمانی رەگەزی نێرینەدا بێت و بەئارەزوو فەرمانی ئەو بەکاربهێنرێت هەتا لە پرۆسەی هاوسەرگیریشدا قەدەغەو حەرامە ژن بە ئارەزووی خۆیی بۆچێژی خۆی لەگەڵ هاوسەرەکەیدا جووت بێت و کردەی سێکسی ئەنجام بدات و جەستەی خۆی بۆ خۆی بەکار ببات، بەڵکو ئەو کەرەستە و ئالەتێکی سەرەکی پرۆسەکەیە بۆ رەگەزی بەرامبەرو خۆی بێبەش و دەرکراوە لە پرۆسەکە. بۆیە هەمیشە ژن شەرمی لە جەستەی خۆی و هەتا ناوهێنانی ئەندامەکانی مێینەی خۆی کردووەو بە مافی خۆی نەزانیوە کە رەفتار بە جەستەی خۆیەوە بکات، چونکە کۆمەڵگەو کلتوری کۆمەڵگە ئەم مافەی لێسەندۆتەوەو کردویەتییە بەشێك لە ناکاری، بۆیە زۆر جار لە ناو پرۆسەی هاوسەرگیریشدا تا ئەمڕۆ بۆ ژنان بێ ئابڕووییە گەر دەستپێشخەر بێت لە

کردەی سێکس و جووت بوون، تەنانەت لە لایەن هاوسەرەکەیەوە بە بێ ئابڕو تەماشا دەکرێت، چونکە داب و نەریت وایە کە پیاو ئەم رۆڵە ببینێت و ئەم مافە تەنیا بۆ پیاوەو نیشانەی هێزی پیاوەتی لەوەدایە کە ژن بکاتە بوونەوەرێکی خەسیو و دەستەمۆ و کۆیلەی بەتاڵکردنەوەی حەزە سێکسییەکانی رەگەزی بەرامبەر.

سێیەم: کەدەڵێت" **بەراستمە رەنگە ترسی خۆم بێ... ترسی من لە ژن کە رەنگە بگەڕێتەوە سەردەمی منداڵی**".

وای دەبینم لێرە بە روونی باس لەو تەلیسمە گەورەیە دەکرێت کە لەنێوان ژن و پیاو لە منداڵییەوە هەیە، ترسی نزیك بوونەوە و قووڵبوونەوەی ئەو پەیوەندیەیە لە نێوانیاندا. برسی بوونی ژن بەو رادەیە بۆ تێرکردنی ئەو غەریزەیە کە دەڵێت" **دەخۆی ئەمشەویش نەخۆی شەوێکی دیکە دەخۆی**".

ئایا لە حەقیقەتدا بێ شتە دەمامکاوییەکان تاکی مێینە بەو ئاستە برسییە بۆتێرکدنی غەریزەزەیەندییەکەی یاخود مەبەستی لەو برسێتییە نیشاندانی دیوێکی دییە لەقەدەغە و حەرامەکانی بەکارهێنانی جەستە و چەپاندنی هەموو حەزە سێکسییەکانە لای تاکی مێینەو حەزەکانیەتی بۆ بەتاڵکردنەوەو تێرکردنیان وەك هەر تاکێك لە رەگەزی بەرامبەر وەك مرۆڤێك کە مافی سروشتییە وەك هەمووغەریزە مرۆییەکانی دیکەی مومارەسەی بکات، کە پێموایە مەبەست لەو برسێتییە هەموو ئەمانە بێت کە باسکران. کاتێکیش بەو شێوەیە باس لە حاڵەتی جووتبوون دەکات کە بگاتە ئەوەی مێینەکە نەگاتە حاڵەتی ئورگازم تا نێرینەکە قوت نەدات. کە بەندیشی دەکات بێ لەنارەزووی غەریزەیی نێرینەکە قوت دەدات... بەوەی کە خۆشەویستی ناچاری دەکات ئەمە بکات رێك ئەو واقعە پیشان دەدات کە لە پەیوەندی نێوان رەگەزی مێینەو نێرینەدا بەرجەستەیە. کە تێیدا رەگەزی مێنە تەواو لەو غەریزە گەورەیەی مرۆڤ بێبەش کراوە . بەڵام ئەوەی جێی پرسیارە ئەوەیە کە لە زۆربەی دەقەکاندا ژن خۆی وەك کاراکتەری مێینە باس لەو پەیوەندییە ناکات، بەڵکو بەرامبەرەکەی باسی دەکات

وەك دەروێش بایز کە دەڵێت" **ئەگەر هەمین خۆیم بۆ شل کات هەموو شەوێك دووجار دەپەڕم**"، ئەمەش نیشاندانی هێزو دەسەڵاتی پیاوە یاخود ئەمین بە گوڵناز دەڵێت" **جاران سیسەمێکی گەرم کۆی دەکردینەوە... ئێستا ئەو سیسەمە نییە و**

**هیشتا گوڵناز تەڕو هەوەس بزوێنە"**. جوانترین وێنەی دوو دڵداریش لە جووتبوونیان لەیەك پێخەف دەبێت. هەر بۆخۆشی بەگوڵناز دەڵێت **"ئەو کافرە بایەخێکی زۆر بەخوێن و گۆشت دەدا لای ئەو ئەو خوێنە لە عەقڵیش بەتینترە"** کەچی گوڵناز دەڵێت: **"ژیانی ناو نوێن هەموو شت نییە"**.قسەکردنی نووسەر بەم جۆرە و بەم زمانە خود بینی و جیهانبینیی پیاو بەرامبەر رەگەزی بەرامبەر دەخاتە روو کە لە کۆمەڵگەی کوردیدا بووەتە کللتوورو تێڕوانینێکی باو لای سەرجەم پیاوانی کۆمەڵگە،کە هەمیشە ژن وەك کائینێکی گوناهکارو گوناهبار بەجەستەی دەبینێت.لەم چەمکەوە کار لەسەر تێکشکانی دەکات، بەهەمان تێڕوانینیش هێزی پیاوەتی خۆی بە توانای کردە سێکسییەکان دەبینێت. ئەمەش جێی پرسیارە ئایا بۆ نووسەر کە دەبێتە کاراکتەری ئافرەت لەو مەسەلەیە نادوێت.ئایا ئەمەش گوزارشتە لەو حاڵەتەی تاکی مێینەی تێدایە کە جەستەی خۆی وەك شەرمێك و گوناهێك دەبینێت، بەهەمان شێوە ئەو هەموو سێکس بینییەی منداڵێکی وەك فەرهاد بۆ شیرینی خۆشەویستی لە تەمی سەرخەرەند، چوونی کچانی حەسار بۆلای ئەسپ و پشیلە و خۆدانەبەر تریفەی مانگ و رەدووکەوتنی کچانی حەسار لەکاتی روخانی حەسار بەو رادەیەی بەوە بگات زولێخا و سارا لەگەڵ زێوانێك کە مجەوری مردووانە غەریزە سێکسیەکانیان بەتاڵ کەنەوە، ئەم هەموو چەپاندنە ئاخۆ ئەمە واقعی رەسمکردنی ناخی مێینەیە... ئایا کەوایە بۆ مێینەیەك نەهاتووە رەسمی ناخی خۆی و ئەم هەمووچەپاندنە بکات..بۆچی نووسەرێکی وەك شێرزاد حەسەن ئەم رەسم کردنە دەکات..ئەمە بۆ چییە و دەیەوێت چی بڵێت؟

## تەوەری سێیەم: ئافرەت و پرسە کۆمەڵایەتیەکان

.. لەپاڵ بەکارهێنانی ئافرەت و کردنی بە کاراکتەری سەرەکی لە دەقە ئەدەبیەکانی **"شێرزاد حەسەن"** دا، گرنگترین شت کە پەیوەست بێت بە تاکی مێینە، بێجگە لەو چەمکانەی باسی لێوەکرا خستنە رووی چەندین پرسی کۆمەڵایەتیی و دیاردەی کۆمەڵایەتییە،کە لە هەموویاندا تاکی مێینە قوربانییە... پێموایە هەموویان رەنگدانەوەی واقعی کۆمەڵگای کوردین... کە نووسەر بەزمانیك لێیان دەدوێت هەتا خودی تاکی مێینە خۆشی بەو شێوە زمانە لێیان نەدواوە،

شێرزاد حەسەن بوێرانە پەنجە دەخاتە سەر پرسەکان و هونەرمەندانە تۆماریان دەکات و لەیەکەم هەنگاوەوە ئافرەت لەو پرسە ئاگادار دەکاتەوە کە پرسی سیستمی باوکسالاری و دەسەڵاتی نێرانەیە کە ئەوبەردەوام لە پەراوێزیدا پاشکۆ وقوربانییە.

ئەم زەنگەش لەو کاتەوە لێدەداتێ کە دەڵێت:

"**پێشکەشە بە رۆحی نەنکم بەیادی هەڵگەڕانەوە و هەڵەتەبوون "پلکە خەجێ... حیکایەتەکانی... کە پێکەوە لە گۆڕنران"** لە پێشکەشکردنی هەردوو رۆمان "**پێدەشتی کارمامزە کوژراوەکان و تەمی سەرخەرەند**" دا، کە بۆخۆی سەراو رێژن لە یاخیبوون و هەڵگەڕانەوە لە پرۆسەی رەدووکەوتن. کە تێیدا چارەنووسی ئافرەت چارەنووسێکی هەمین ئاساو هەموو کارمامزەکانە کە ئاغاو کوێخاکانی کۆمەڵگا راویان دەکەن...

- دووەم مامەڵەی کڕین و فرۆشتن لە پرۆسەی هاوسەرگیری وەك لە گوڵی رەش بەهێزۆ دەڵێت"**تۆشیان کڕی..تۆش وەك ئەم گوڵانە بە دەستیانەوە سیس دەبیت..هەڵدەوەریت...!**" هەروەها لە رەنگاڵە بە مریەم دەڵێت"**مریەم زەوتیان کردی بۆیان کرا،یەکێ لەو کوڕانە تۆی لە من زەوتکرد،خاوەن ئەو دەست وپەنجانەی بە ئەنگوستیلەی عەیار بیست ودوو رازاونەتەوە**"

-**سێیەم کێشەی فرەژنی**: ژنە لە ژمارە نەهاتووەکانی حەسار بەو شێوەیەی کە لە حیوارەکانی نێوان ژنەکاندایە.

- **چوارەم کلتوری ناموسپارێزی** :کوشتنی ژنان بەپاساوی سڕینەوەی ناموس لە خنکاندنی خانزاد لە چیرۆکی "**زەلکاو**" لە ناو زەلکاوێکدا و فڕێدانە ناو خەرەندی خوشکەکەی شیرین و شیرین لە **رۆمانی تەمی سەرخەرەندا**"وبڕیاردانی کوشتنی گوڵنازی ژنی ئەمین دوای تەلاقدانیشی لەلایەن ئەنوەری برای ئەمین کە بە ئەمین دەڵێت"**ئەمین گوێ بگرە من حەوسەڵەی قسەی ناو کتێبانم نییە...بڕیارمداوە ئەو ژنەی تۆ دەبێت بکوژرێت**"،**پاشان دەڵێت من بڕوام بەوە نییە کەس بکوژرێت،بەلام خەلکی دەڵێن کۆنە ژنەکەی ئەمین قەحبەیە...لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت "تۆ هەقت نەبێ ئەم هاوینە من ومناڵەکان سەفەرێکی دەرەوەمان هەیە، پارەیەکی مۆڵ دەدەمە زەلامێکی لێزان وکەسیش نازانێ** ... کە دواجار بەم جۆرە دوای جابوونەوەو لە هەندەرانیش گوڵناز چارەنووسی بە کوشتن کۆتایی دێت.وەك لە

یاساکانی ئەم وڵاتەشدا بە ئاشکرا ئەم کلتووره بۆتە بەشێك لەو یاسایانە وەك یاسای سزاکانی عێراق و یاسای باری کەسێتی بەهەموو هەمووارەکانیانەوە،کە تا ئێستا نەیانتوانیوە خۆیان لەم کلتووره داماڵن. نموونەش ئەو دەیان ژنەیە کە ساڵانە لە کۆمەڵگەی کوریدا بە کلتوری شەرەف دەکوژرێن.

- **پێنجەم کێشەی میرات:** کە وەك ماددەیەکی سەرەکی یاسای باری کەسێتی ژمارە" ۱۸۸" ی ساڵی ۱۹۵۹ تائەمڕۆ درێژە بە نابەرابەری و نادادوەری بەرامبەر بەتاکی مێنە لە میرات وێڕایی هەموو پێشکەوتنەکان و بوونە خاوەن کاری ژنان دەدات.

- **شەشەم موڵکایەتی ئافرەت بۆ پیاو:** لە چیرۆکی "میم" کە ئەنوەری برای ئەمین بە ئەمین دەڵێت"**چ پیاوێکت بینیوە خانووبەرە لەسەر ژنەکەی تاپۆ بکات**"،ئەمەش لە پرۆسەی مارەبڕین بە پێی یاساو داب و نەریتی باوو گشتی کۆمەڵگە بەردەوامە.

-**حەوتەم جیابوونەوە و تەڵاق و تێڕوانینی باوی کۆمەڵگە بۆ ئەو ژنانەی تەڵاق** دەدرێن یاخود جیادەبنەوە بەهەرهۆکارێك بێت، تاکی مێینە لە میانیدا تەواو تێکدەشکێنرێت ولە پرۆسەکانی ژیان بەتایبەت پرۆسە کۆمەڵایەتییەکان دەردەکرێت.

- **هەشتەم بێوەژن لە خەونی جاڵجاڵۆکەکان:** کە دوای مردن و لە دەستدانی پیاو ئەم ژنەی ناوی بێوەژنە دەکرێتە تاکێکی خەساو.

- **نۆیەم قەیرە کچەکانی حەسارو ئەم پرسە** وەك پرسێك و دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی،کە ژن تێیدا بە جۆرێکی تر قوربانییە کە بۆی نییە لە دەرەوەی پرۆسەی هاوسەرگیری تا دوا چرکەی تەمەنی مومارەسەی سەرەتایترین مافی خۆی بکات و گەر بیکات بەر گولەی حوکمی کلتوری شەرەف پارێزی دەکەوێت. جا ئیتر بەهەرهۆیەك چانسی چوونە ناو پرۆسەکەی نەبووبێت هەتا ئەگەر خودی خۆی بڕوای بە پرۆسەی هاوسەرگیری نەبێت و رەتیبکاتەوە، بەتایبەت ئەو جۆرە پرۆسەیەی کە تێیدا ئەو وەك کالایەك مامەڵی کرین و فرۆشتنی پێوە دەکرێت.بەم زاراوەیە لێیدەدرێت و سوکایەتی بەبەهاو کەرامەت و کەسێتی وەك مرۆڤێك دەکرێت.

- **دەیەم بڕوابوون بەخەون و جادوو و فاڵ گرتنەوە**، ئەگەرچی رەنگە وا لە جادو بگەین کە ئەمەیان لە کەمکردنەوەی تاکی مێینە بێت، بەڵام لە بۆ خۆی واقعێکە لە ناخی کۆمەڵگەی کوردیداو زیاتریش تاکی مێینە کەوتۆتە ژێر بارییەوە. کەوابێت

دەبێت بڵێین شێرزاد حەسەن لە پەنای چ مەبەست و فیکرێکەوە ئەمە بۆ رەگەزی مێینە دەکات لەو کاتەی کە خۆی باوکێکی دەسەڵاتدارە؟

**راوبۆچوون و وەڵامەکانی شێرزاد حەسەن بۆ بابەتەکە**

بەراستی شت زۆرە، رەنگە نەتوانم باش خۆم کۆبکەمەوە، بەهەرحاڵ یەك دوو تێبنی سەرەکیم هەیە، ئەگەر بتوانم لێی بدوێم. پرسیاری یەکەمی هاوڕێن خان لەسەر ئەوەی، کە ئایا پیاو وەك ئەوەی کە رەگەزێکی تره دەتوانێت قسە لەسەر ئافرەت بکات. بای چەند دەتوانێت لە فیکر و ئەدەب و لە هونەردا ئەو شتە بکات کە کەسێکی ترە.

**دوو رای جیاواز لەسەر ئەوە هەیە:**

-یەکێکیان دەڵێ نێر و مێ بەحوکمی ئەوەی لە رووی فیزیۆلۆژییەوە زۆر شتیان لە یەك دەچێت... رێژەیەکی هۆرمۆنی ژن لە پیاودایە و پێچەوانەکەشی هەر راستە لە زۆر هەڵسوکەوت و خەون و خولێا و خولیا و حەز و ئارەزوو گوایە ژن و پیاو لە یەك دەچن.

-رایەکی دی هەیە، کە زۆر توندە لەسەری بەوێنەی فێمنیستەکانی کە ئێستا زۆر چالاکن لە رۆژئاوا، بەتەواوی فێمنستە توندڕەوەکان گومانێکی گەورەیان لە کۆی ئەو میراتە فیکری و هونەری و ئەدەبییە، کە پیاو دایمەزراندووە، لەبەرئەوە بڕوای ئەوان بەتەواوی ئەوەیە کە ئەم میراتە ئەسڵەن لە بنەمادا بەدەنگی نێر بۆ بەرژەوەندی نێر بە زمانی نێر بۆ نێر نووسراوە، من کەمێك هاوسۆزم لەگەڵ رای ئەو فێمێنیستە توندانە، لەبەر ئەوە ئەگەر سەیری هەرسێ کتێبە ئاسمانیەکە بکەین دەبینین خودا بۆخۆی لەوێدا نێرە، واتا دەبێت گومان لەهەرسێ کتێبە ئاسمانییەکەش بکەین، چونکە بڕوای من وایە ئەگەر سەیر بکەیت هەرسێ کتێبە ئاسمانییەکە تا دەگاتە ئەو میراتەی لە توراسی یۆنانەوە وەری بگری سەیر دەکەی تێیدا ئافرەت پەراوێزکراوە، فەرامۆش کراوە، دەرکراوە، دەتوانین بڵێین ئەگەر بگەڕێینەوە سەریان، کە ئینسان دەخوێننەوە قەناعەتێکی تەواو هەیە، کە بە ملیۆنەها ساڵ ژن حوکمی کردبێت لەم دنیایەدا، هەمووی دەهەزار ساڵە پیاو توانی سەرداری ئەم ئەرزە بێت، بەتایبەت لەناوچەی میزۆپۆتامیا، کە دەکاتە ئەو ناوچەیەی ئێمە ئێستا لێی دەژین، گوایە یەکەم تێکشکانی ئافرەت لەبەردەم پیاودا یان مێ لەبەردەم نێردا لێرەدا

بووه.. پێویست ناکات ئەو حیکایەتە بگێڕمەوە کە زۆربەی خوادوەندەکان ژن بوون ئەم قسەیە زۆر راستە لە شەش تا دە هەزار ساڵ دەبێت پیاو حوکم دەکات، پیاو ئاغایە، سەردارە، پیاو خودایە پیاو بکوژ و ببڕ خۆیەتی، بەراستی دەتوانم بڵێم ئافرەت ئێستا هەمووی سەت ساڵێك نابێت، ئەگەر بگەڕێینەوە شۆڕشی شەستەکان خەریکە ئافرەت دێتەوە مەیدان، باس لە مافەکانی خۆی دەکات، بەڵام ئەگەر لە رووی فیکری و ئەدەبییەوە قسەبکەین نەخێر دەتوانم کەمێك بەرپەرچی ئەوە بدەمەوە بڵێم بەڵێ نێرەکان، پیاوەکان دەتوانن زۆر بەکارامەیی و بەلێهاتووی باس لە رەگەزەکەی تر بکەن، چونکە کە تۆ ئەو میراتە دەخوێنیتەوە من رێزم بۆ ئەو گومانە گەورەیە هەیە، من ئەو گومانەی ژنەکانم زۆر خۆش دەوێت، بەڵام کەمێك زیادەڕۆیی تێدایە، کەمێك توندڕەوی تێدایە... ئەم روانینەی فێمێنستەکانی دونیا ئەوانەی ژن پەرستن یاخود بڕوایان وایە دەبێت ئەو مێژووە بگەڕێتەوە یان گومان لە مێژووی فیکر و ئەدەب و فەلسەفەی ئینسان بکرێت لەبەرئەوەی خالیقەکەی،خولقێنەرەکەی نێرە، لە حەقیقەتدا کە سەیر دەکەیت ئەمڕۆ ژنان بۆخۆشیان کە دەیانەوێت ژن بخوێننەوە، ناچارن دێنە ناو ئەدەب ئەو هەزاران پیاوانەی نووسەربوون و کاراکتەری ژنیان هەبووە و زۆر بەرۆحی ژنان نزیك بوون دەخوێنینەوە، چونکە بوونەوەرێك نییە لە ئەستێرەیەکی دی بژی، بوونەوەرێك هەیە دەستی لێدەدات، بۆنی دەکات، خەونەکانی دەبینێ، گوێی لێدەگرێ، لەگەڵی دەژی، لەگەڵی دەگری، لەگەڵی پێدەکەنێ، شەڕی لەگەڵ دەکات، لەگەڵی ئاشت دەبێتەوە ، بڕوام نییە دوو بوونەوەری ئەوەندە لەیەك دووربن، بەڵام من بڕوام وایە بەڵێ دەکرێ،گەرچی من زۆر لەگەڵ ئەوە هاوسۆزم کە بەڵێ پیاو بۆخۆی کائینێکی غەریزییە، شەهوانییە، حسییە، راوچییە بەدرێژایی مێژوو، سەیرکە پیاو راوچی بووە، هەتا لە هەموو ئاستەکان، لەسیاسەت لە رووی کۆمەڵایەتی... پیاو راوچییە زۆربەی کات... بەراستی مێژووی ئافرەت مێژووی بەنێچیربوون بووە، بۆ نموونە کاتێك لە" **گۆستلاڤۆس**" " رۆماننوسی رووسی دەپرسن کاتی خۆی "**مادام بۆڤاری** دادگایی کرا لەسەر بەدڕەوشتی، لەبەرئەوەی ژنێکی وەك مادام بۆڤاری چوار دۆستی لە گۆڕێدایە لەیەك کاتدا، کۆمەڵگەی فەرەنسی دەڵێت: ئەمە سوکایەتیە بۆ ژن... بۆیە من حەز دەکەم بە هاوڕێ خان بڵێم ئەك شتی لەبیر نەچێت ئەوە دیدی نووسەرێکی کورد و هیند و پاکستان و ئینگلیز و

فەرەنسی نییە سووك سەیری ژن دەكات یاخود بەرز دەینرخێنێت یا گەورەی دەكات یان بچوكی دەكاتەوە، ئاگامان لەوە بێت ئەمە یەك سستمی ئەخلاقی هەیە، یەك فەرهەنگ هەیە، ئێمە كە ئەمڕۆ لێرە دانیشتووین گیرۆدەی یەك دنیا كللتورین، كە تۆ باس لە بۆرژوازییەت دەكەی بە پێچەوانەوە من هیچ شتێكی بۆرژوازی نابینم لێرە، هیچ سیفەتێكی سەرمایەداری ئەوا تۆكمە و دامەزراو نابینم، ئێمە هێشتا وەكو كورد لە قۆناغی دەرەبەگایەتی.. لە قۆناغی شوانكارەیی دەژین بەهەموو پەیوەندی و فەرهەنگێكەوە، راستە هەندێك ئەشوغای بۆرژوازی كراوە لەئاستی ئابووری و پیشەسازی، بەلام بڕوای تەواوم هەیە كە ئێمە هێشتا لە قۆناغی دەرەبەگایەتیدا دەژین، هەروەها ئەو ئەخلاقەی رەسمی نێوان نێرو مێی كردووە لە كۆمەڵگەی كوردی هێشتا ئەخلاقێكی دەرەبەگییە، من لەبیرم ناچێ كە خێزانەكەم چێشتم بۆ لێدەنێت، جلم بۆ دەشوات، كە دەتوانێ نەیكات، بەلام من ناغایەكم، دەرەبەگێكم، خودانێكم، بەراستی بەبڕوای من ئەمە ئەخلاقێكی پووچەڵی من نیشان دەدات، لەبەرئەوەی من رازیم بەوە، راستە ئەوە سیستمێكە ژن دەڵێت **" من كاری ماڵ دەكەم"**، پیاو دەڵێت **" من لەدەرەوەم"**، چۆن جاران لە ئەشكەوت بوو، ژنەكە كشتوكاڵ و منداڵەكەی بەخێودەكرد پیاوەكە دەبوو بە راوچی بەو شێوەیە لەبن ئەم سیستەمە لەژێر ئەم پەردەیە دەیان زوڵم و زۆر دەكرێ، بۆیە من دەمەوێت ئەوە بەهاوژین بڵێم بای ئەوەندە ئەو كەسانەی ئاگایان لە ئەدەب و هونەرە بەبڕوای من زۆر بەپاكی دەتوانن وێنە بۆئافرەت بدۆزنەوە، لەبیریشمان نەچێت هێندەی كاراكتەری ژن جوان و خراپ و ناشرین بێت. ئینسان بۆخۆی، من بۆخۆم یەك دنیا ناشرینی و جوانیم، ئەو ئافرەتەی كە لە بەرامبەریشم دانیشتووە هەر وەك منە، ئیتر رەسمكردنی ئێوە گوناه نییە، بێ لەوە كێشەی ئەدەب ئەوەیە رووكەشە، كاری ئەدەب و هونەر بەراستی هەڵكۆڵینێكە، ژنێكی رەخنەگری بیانی هەیە دەڵێت **"ئەدەبی فیكش، كە دەكاتە چیرۆك و رۆمان، ئەگەر فەزائیحی نەبێت، واتە پڕ فەزائیح نەبێت، واتا پڕ فەزیحەت نەبێت، هەر ئەدەب نییە، هەر نووسین نییە، هەر چیرۆك نییە"** واتا شتێك نییە هەر ئاوا بە ئەدەب دابنیشن، ئاقڵ بچینە ماڵەوە، من نازانم هەموو رۆمانە گەورەكانی جیهان باس لەو نهێنیانە دەكەن، كە پیاو تەریق دەبێتەوە، كە تەنیا لە خەونەكانی خۆی دەیانبینێت، بڕوای من وایە داهێنان و نووسین پرۆسەیەكە، كارێكە

زۆر لە خەون بینین دەچێت، هەر هەمووتان کە لێرە دانیشتوون بە سەدەها خەونی واتان بینیوە کە ناتوانن بیگێڕنەوە، نە بۆ هاوسەرەکانتان، نە برا، نەخوشك، نە دایك نە باوك، نەبەکەڵکی خۆت دێت، بۆیە دوبار دەیڵێمەوە کارکردنی داهێنان و نووسین بەشێکە لە هەڵکۆڵین لە لاشعور، لە نەست، لەناخود ئاگاهی، کابرایەکی ئەفەندی ئاقڵ دانیشێ بڵێ من چیرۆکێکی خۆشەویستی دەنووسم نازانم ئێمە لە ئەدەبی کوردی بە حوکمی ئەو کلتورە دارزاوەی هەمان بووە، زۆر شەرمنین، زۆر ترسنۆکین، کە پاشخانی ئەخلاقیمان و بیرکردنەوەمان کە پاشخانێکی ئاینی بووە... جەستەمان هەر فەرامۆش کردووە، تازە دوو سێ کەس دەوێرن باس لە جەستە بکەن، تازە بە تازە ، باشە پێمنالێن دەرکەوتەکانی رۆح چییە، ئەگەر جەستە نەبێت، تۆ کە منت خۆش دەوێت بەچی ئەو خۆشەویستییە دەردەبڕیت... بە چاو... بە نیگا، بەدەست، بە ماچ، چوزانم... نازانم دەبێ رۆح چی بێت، شتێکە لە هەوا دەگیرێ، نازانم لە کوێیە رۆح، من بڕوای تەواوم بە قسەی لۆرانس هەیە، تۆزێك لەمەو پێش هاوڕێن باسی خوێنی کرد، دەڵێت ئەوەی خوێن حوکمی دەکات گەورەترە لەوەی عەقڵ حوکمی دەکات، چونکە خوێنەکە سەرچاوەی ژیانە، ئەو گەرمیەیە کە لە وجودتا هەیە، پێمنالێی رۆح لە دەرەوەی خوێن لەکوێ دەژیی، ئەمە زۆر سۆفیانەیە، من زۆر رۆحانیشم، بڕواشم بەو رۆحیانەتە هەیە، پێشموایە جەستە ناجوڵێت، ئەگەر رۆح نەجوڵێت، مکنیش نییە جەستە بجوڵێ و رۆح نەجوڵێ، رۆح بجوڵێ و جەستە نەجوڵێ، هەردووکیان هاوتای یەکن، هاوشانی یەکن، یەکیان ئاوێتەی ئەویترە، یەکیان دەنگدانەوەی ئەویترە، یەکێکیان نییە بنوێ و ئەویتر بەخەبەر بێت، کە جەستە نووست رۆح دەنوێت، کە رۆح نووست جەستە دەنووێت، کە رۆح بەئاگا هات جەستە بە ئاگا دێت... شتێك نییە ئەم دووانە لێك دابڕێت، شتی وا لەسەر رووی زەوی نییە... بەڵام ئەگەر بەوجۆرە فەقێیانە بیر بکەینەوە ئەمە شتێکی دییە، مەسەلەیەکیترە. مەسەلەی چینایەتی نییە بەتەنییا.. **"چیرۆکی رەنگاڵە و گوڵی رەش"**، ئەسڵەن لێرە نە دەوڵەمەند بەختەوەرە نە هەژار نە فەقێ نە مەلا نە من.. کێشەکە ئەوەیە کۆی ئەو کلتورە کلتورێکە کە رەگەزەکەی تر بە دوژمن سەیر دەکات. من هەزار جار، سەدجار گوتوومە لە کۆمەڵگەیەك لەقۆناغی خوێندنی سەرەتایی تا زانکۆ، کە لە هەموو خانە و گازینۆ و چێشتخانەو خواردنگەو شوێنێك

شوێنی تایبەتمان هەیە بۆ خێزان، لە هەموو شوێنەکان کە نێر مێ نەناسێت تۆ بەتەمای چیت، جا بۆ هەژار حاڵی جواترە لە دەوڵەمەند، دەوڵەمەند بۆ حاڵی جواترە لە هەژار، رەنگە ئەو بتوانێت شتێك بکڕێت بۆ نموونە ئەو دەتوانێت جەستە بکڕێت، پێخەف بکرێت، بەلام مەرج نییە بتوانێت خۆشەویستی بکڕێت، واتا گیرۆدەبوون ئەوەیە ئەو هێزە ئیرۆسییە ئەو تاقەتە سۆزدارییەی لە تۆ هەیە کە بەرای من هەژار و دەوڵەمەند تێیدا هاوشانی یەکن، هەردووکیشیان دوو بونەوەری زۆر نەگبەتن، بەلام رەنگە جیاکاری بۆ ئەوە بگەڕێتەوە هەژار بێ گیرفانە، لاوازە، هەڵبەت نەهامەتیەکانی ئەو زۆرترە، بێ لەمە من فعلەن بڕوام وایە کۆمەڵگەیەك وەك مارکیز دەڵێت **"ئەگەر ئیشتراکیەت ئەگەرسۆشیالیزم خەونێك بێت خەونێکی جوانە، دەبێ بڕوامان پێ بێت کە ڕۆژێك بێتە دی، ئەگینا لەدەرەوەی ئەوە بەربەریەت، وەحشیەتگەری هەیە"**، ئەوەی کە ئەمڕۆ لە دونیا دەیبینین وەکو جاك دێرا دەڵێت **" سەدەی بیست و یەك یان سەدەی وەحشیەکان، بەربەرییەکان دێنەوە یان دەبێت جارێکیتر بگەڕێتەوە"** واتا لێرە ئەو کتێبە جوانە هەیە ،کە مارکس بە هاملێتی دەچوێنێ، **کە دانیمارك بۆگەنی کردووە لەناوەوە بۆتە میرنشینێکی بۆگەن هاملێت دەیەوێت پاکی بکاتەوە**، دەڵێت مارکس ئەو رژۆگارە سەری هەڵدا ئاوای دەگوت بۆ ئەوروپا، دەیگوت ئەوروپا بۆگەنی کردووە، ئێمە ناتوانین گاڵتە بەوە بکەین، کەسێك ناتوانێت گاڵتە بەنەبوونی چینایەتی بکات، من بۆ خۆشم تا دەمرم بڕوام وایە زۆربەی نەگبەتی و نەهامەتیەکان، بەشێکی گەورەی مەینەتی ئەوەیە کە یەکێك لە سەرەوەیە یەکێك لە خوارەوەیە، بەلام ئەوەی کە زەقی دەکاتەوە ئەو کلتورە ئەخلاقییەیە، ئەو فەرهەنگەیە، کە دەرەبەگ و سەرمایەدار و خاوەن کارگە دەکات بەیەك، هەموویان گیرۆدەی یەك سیستمی ئەخلاقی دارزیوی بۆگەنن. ئەمە کێشە سەرەکییەکەیە کە هەموومان هاوبەشین لێی، من بڕوام وایە لەزۆربەی بەرهەمەکانی من تەمی سەرخەرەند... هتد، ئەمە بوونی هەیە.

هاوژین تۆزێك بۆی چوو... ئافرەت راستە مەوشورێکە کە ئەلوانی تەیفی پێدا دەڕوات، جوڵێنەری ڕووداوەکانە، کاراکتەرە، بەس بۆخۆی ئافرەت لەمێژوو دەرکراوە... ئێستا باسمان کرد ئافرەت ئەو بکەرە نییە، بەڵێ جوڵێنەری ڕووداوە، بەلام لە کلتوری ئێمە ژن لە بەندیخانەکاندا دەیبینین، ماڵەکان زۆر لە بەندیخانەکان

دەچن، زۆر لە زیندان دەچن، قوتابخانەکان بەهەمان شێوە لە زینـدان دەچـن... هـەتا سەنتەرەکان زۆر لە زیندان دەچن. بەبڕوای من ئەم بارەی ئێمە تێیکەوتووین، شتێکە ئافرەت تێیدا فـەرامۆش کـراوە، بۆیـە لـە سـەرخەرەند شـیرین بـوونی نییـە، هێـرۆ، مریەم...لە گوڵی ڕەش ورەنگاڵە بوونیان نییە، ئەمانە لە مێـژوو دەرکـراون، راسـتە کۆمـەڵێك ڕووداو، کۆمـەڵێك کاراکتـەر وەك تـەونی جاڵجاڵۆکـە بـەدەوری ئـەودان دەخولێنـەوە، بـەڵام ژن وەك باسـم کـرد کائینێکـە دەرکـراوە، فـەرامۆش کـراوە، پەراوێزکراوە، بوونەوەرێکە مافی قسەی نییە، تا ئێستا ئافرەتێك ناتوانێت بە ئازادی خۆی لە شەقامێکدا پێبکەنێت بە سـۆزانی لەقەڵـەمی دەدەن، دەڵـێن تـەواو نییـە، لەجادە پێدەکەنێت، پێی دەڵێن ڕوشتی تەواونییە ، دوو کـچی قوتابخانـەی ... ئـەم نەگبەتە نوکتـە بگێڕنـەوە فەقیرانـە تـا دەگەنـە ماڵـەوە دەخنکـێن... مـن تێناگـەم ئافرەت لێرە لە کوێدا وجودی هەیە، ئەوەتا حوکمی ئەنجومەنی کاتی دەبێت محەجەبە بێت دەسکێش لەدەست بکات ئینجا تەوقـەبکات... ئەمـە عێراقـی تـازە... ئەمـە پیاو پێکەنینی پێ دێت، بەڕاستی پیاو شەرم لە خـودی خـۆی دەکـات... لـە کوێـدا ئافرەت بوونی هەیە، دەبێت سوێند بە قورئان بخۆی، حیجابـت لەسـەربێت، لـەکوێیا ئافرەت جارێکی دیکە هاتۆتەوە مەیدان ، ئەی باشە بۆ دیسانەوە مافی فێمنیستەکان نەبێت ئەگەر چوار فێمنیست لە کوردستان نـەبێت بڵێـت مـن گومـان لـەو کلتـوورە دەکەم، کە کلتووری پیاوە، کە کلتووری نێرە، هەموو فیکرو ئەدەب و ئەخلاقتان هی نێرە، هەموو شتەکانتان هی نێرە، بۆیە من لە کوێ بەرهەمەکانم ئافرەت جوڵێنـەری ڕووداوە دەجووڵێـت، جووڵـەی هەیـە، زینـدووە، بـەس بۆخـۆی لاتـەریك و پـەراوێز و خنکێنراوە، لەژێر زەمینەکان فڕێ دراوە، بۆیە ئەوەی تـو باسـی دەکـەی لـە حەسـار کەس نەچۆتە لای ئەسپ و ئێستر ئەوە کوڕەکـانن دەچـن بەگـژ ئێـسترو ماکـەرەکان، بیرتـان نەچـێت کـۆی حەسـار خەونێکـە، کێشەی کـچەکان ئەوەیـە کـە ئـەوان لـە خەونەکانیان بۆنی پیاو دەکەن... من لە حەسار لە زۆربەی بەرهەمەکانی دیـم بـڕوام بەوە هەیە کە ئەگەر تەمەنی کۆیلە بوون، تەمەنی دیلێتی و ئەسارەت بەندەواری کە درێـژ بـوو هـەتا ئێـوارە ئـازادی بـەرێ نازانێـت چـی لێبکـات، ئـازادی تۆقێکـە دەتخنکێنێـت، لەبەرئەوەیـە تـۆ چ لـە ئـازادی دەکـەیت کـە ئـازاد نـەبوویت، لێـرە کۆمەڵگەیەك نییە بە ناوی کۆمەڵگەی ئازاد. لە قوتابخانەکانەوە بەسەقەتی پەروەردە

دەبێت، لە خێزانەکانەوە بە سەرکوتی و زەلیلی و ملکەچی گەورە دەبێت. **"رایش" دەڵێت" دایك زەلیل بێت، یەك نەوەی گەورە زەلیل دەبێت"**. ئێمە دایکەکانمان چەند زەلیل و ترسنۆك و شەرمن و قوڕ بەسەربوون، قابیلە ئێمە نێر نەچینەوە، ئێمەش نەوەیەکی خەسیو و قوڕ بەسەرین... بۆیە لەحەسار هەموو لەسەر ناستی خەون ئیش دەکەن هەتا کوڕەکە لە کۆتاییدا نازانێت باوکی کوشتووە، ئەمە وابوو. کچەکان بە براکەیان دەڵێن کاکە بۆمان گەڕایی، لە خەونەکان پیاوەکان چەند جوان بوون، کاتێك لێمان نزیك دەبنەوە بۆنی تەویلەیان لێدێت ، چونکە ئەو هەر لە خەوندا پیاوی بینیوە، هەر بەخەیاڵ بینیویەتی، بەخەیاڵ لەگەڵی ژیاوە، لێرە ٩٠٪ ی ژن و مێردەکان خۆشبەخت نین لەبەرئەوەی ئەسڵەن هەر یەکتریان نەناسیوە، بڕۆ سەر ژمێرییەك بکە بڕۆ بچرپێنە بە گوێی هەر ژن و پیاوێك، دانیشە لەسەر مێزی خواردنەوە لەگەڵ پیاوەکان بزانە چ حەشر و قیامەتێکە، با دوو ژن بوێرن قسە بکەن بزانە چ قیامەتێکە، من لەو گلکەند و کورانە گەورە بووم، دەیان جار لە پشت دەرگاوە گوێم لە دایکم و ژنەکانی گەڕەك دەگرت کە چ نەگبەتیەکیان دەگێڕایەوە، من لە ئەدەب و هونەرو فیکر و مارکس و لینین و فرۆید فێر نەبووم من لە ژنە بەدبەختەکانی کوران و گلکەند فێربووم و هەست دەکەم ئافرەت چ زەبوونێکە... لێکدانەوەی پەیوەندیەکان بەباس کردنی سێکسی... من پێموایە من باسی سێکسم نەکردبێت ئەمە تاقەتێکی ئیرۆسی سۆزدارییە کە لە رۆحی تۆ دایە، لە وجودتایە، کە ئەوە کوژرا تۆ دەکوژرێیت. خەون نابینی، خەیاڵ نابینی، جوانی نابینی، تۆ سەیری کچان و کوڕەکانی ئێمە بکە هەتا لە زانکۆ چەندە شەرمن و ترسنۆك و زەلیلن لەسێبەری خۆیان دەترسن، ئەمە تاقەتێکی ئیرۆسییە، سێکسی نییە **"لیبدۆ"** بەتەنیا مەنبەعی شەهەوات نییە، بەتەنیا وەختێ کچێك منی خۆش دەوێت نامادەم بژیم بەس لەسەر خەیاڵات، چونکە هێزێکی سۆزداری، ئیرۆسیم دەداتێ دەڵێ پیرەمێردێك کە تەمەنی (٧٠-٨٠) ساڵ دەبێت دەتوانێت سێکس نەکات، بەڵام پیرێژنێکی هاوتەمەنی خۆی خۆش ویست هەست بە جوانی و ئیانی دەکات.. بەڵام تۆ ناچاریت ئەم پەیوەندییە نهێنییە بکەیت بە بابەتێك بۆ ئەوەی لەوێ بیتەقێنیتەوە، لەوێوە باس لە کوژرانی ئەو ئیرۆسیەتە بکەیت. ئەو تاقەتەی لە ئینساندا لە منداڵییەوە دەکوژرێت... کێتان لێرە چیرۆکی ئادەم و حەوا و گوناهی

یەکەمی بۆ نەگێڕدراوەتەوە، لە منداڵی وکە باڵق بووم دایکم گوتی" **کوڕم جارێکی تر سەیری کچانی گەڕەك ناکەیت سەری خۆت حیز دەکەیت دەچیتە بازاڕ و دێیتەوە، هاوینانیش کاتی نوستن بوو بڕۆ سەربان و بنوو، چونکە لەوانەیە ئاوڕ بدەیتەوە کچە دراوسێ یان ژنێك لە حەمام هاتۆتە دەرەوە**" دایکم وا دەزانێ فەرەنسایە. مردن و لێکدابڕان... پێم بڵێ لای ئینگلیز و فەڕەنسی لە هەموو چیرۆکەکانی رۆمیۆو جۆلێت و چیرۆکەکانی خۆشەویستی ئەسڵەن خۆشەویستی حاڵەتێکی ئەوەندە دەگمەنە لە جیهاندا لەبەرئەوە بەردەوام کۆتاییەکەی مردن و لێکدابڕانە... لەبەر ئەوەی خۆشەویستی گوزارشتە لە هەڵبژردن "ئیختیار" بەدرێژایی مێژوو مرۆڤ خاوەنی ئەو تاك و فەردانییەت و هێزە نەبووە بڕیار بدات، دەزانی بۆ لێرە نایەڵن ئافرەت بڕیار بدات ئەگەر دەرچووی زانکۆش بێت، واتا من هەم، واتا جیاوازم، واتا تۆ هیچ نیت و هەر خۆت نیت،لەبەر ئەوە پیاویش هەمووی بەشمشێرەوە بەخەبەر دێت، چۆن دەبێت ژن بڵێت شوو دەکەم بەوە شووناکەم بەوە... ئەگەر بە دیبلۆماسیەتیش بێت رازی دەکەن، بەم شێوەیە هەڵبژاردن لە رۆژهەڵات و رۆژئاوا گوزارشتە لە فەردانییەتی تۆ، لە کۆمەڵگەیەکی مێگەلەی گاڕانی، کە تێیدا تۆ نیت و لەدەرەوەی خێڵ تۆ بەشەر نیت،لە دەرەوەی حزب تۆ مرۆڤ نیت، لەدەرەوی مزگەوت تۆ بەشەر نیت... تۆ هەڵبەت بۆت نییە ئیختیار بکەیت. بۆ کوڕەکان ئەوەندە مەردن لە ئیختیار کردن، تۆزێك جیاوازییان لەگەڵ کچەکان هەیە، ئەویش ملکەچی یەك دنییا ئابووری و کۆمەڵایەتییە، چ کوڕێك ئەوەندە نێرە، گیرفان لای باوکە، باوکیش لێرە خودایە... مامۆستا خودایە، مەلای مزگەوت هەموو کەس بۆی هەیە قسە لەسەر تۆ بکات، بەڵام تۆ بۆخۆت قسەت نییە، تۆ بۆخۆت نابێ قسە بکەی، راستە ئەفسانەی ئادەم و حەوا مەوجودە لەتەمی سەرخەرەند، لە پێدەشت وەختێك هەمین و دەروێش بایز ڕادەکەن، ئاغا دەبێت بە خودا و گوندەکە بەهەشتەو شاریش دۆزەخە، کە تێیدا هەردووکیان دوایی وێڵ دەبن... چارەنووسیان دیار نامێنێت چی لێدێت، لەبەر ئەوەی هەر هەمان چیرۆکی ئادەم و حەوایە لەسەر ئەرز دووبارە دەبێتەوە... ئینجا تۆ لە فەرهاد لە تەمەنی نۆ ساڵییەوە هەست بە جوانییەکان دەکات، نەمە لەو کاتەدا کە لە سکی دایکیدا هەست بە خۆشەویستی دەکات.